# لا إله إلا الله

واتا و

مەرج و

هەڵوەشێنەرەوە و

فەزڵەکانی

نووسینی
.................................
إبراهيم محمد

بسم الله الرحمن الرحيم

**إن الحمد للّه نحمد ونستعينه ونستغفره ، ونعوذ باللّه من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا، من يهده اللّه فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له وأشهد أن لا إله إلا اللّه وحده لا شريك له، وأشهد أن محمدا عبد اللّه ورسوله صلى اللّه عليه وعلى آله وأصحابه ومن تبعهم إلى يوم الدين بإحسان، وسَلّمَ تسليما كثيرا**

**أما بعد:**

**ئەم نوسینەی بەردەستت بریتیە لە چەند بابەتیك لەسەر ماناو مەبەستەکانی (لا اله الا اللّه)**

**١-ماناک (لا اله الا اللّه)**

**٢-مەرجەکانی(لا اله الا اللّه)**

**٣-هەلوەشینەروەکانی(لا اله الا اللّه)**

**٤-فەزلەکانی(لا اله الا اللّه)**

## واتای ( لا إله إلا اللّه )چییه ؟

سەرەتا هەموو موسڵمانێک پێویستە لە ماناو مەبەستی ئەم وشەیە تێبگات ئەوسا
ئیسلامەتیەکەی تەواو درووستە و لە پەرستنی غەیری خوا دور دەکەوێتەوە ،
چونکە ئەم ئیسلامە لەسەر ئەم وشەیە دامەزراوە و هەموو پێغەمبەرانیش لە پێناو
ئەم وشەیە هاتوون و وشەی تەوحید و تەقواو ئیماندارانە و جیاکەرەوەی کوفر و
ئیمانە ، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموویێت : { فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ } [سورة محمد:١٩]

واتە : بزانە ! کە هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە الله.

وە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموویێت : {وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ} [الأنبياء : ٢٥]

واتە : هیچ نێردراوێکمان نەناردووە مەگەر وەحی مان بۆ ناردوە کە هیچ
پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە الله و بیپەرستن
وە پێغەمبەری خواش ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویێت ((من قال لا اله الا الله
خالصا من قلبه دخل الجنة)). صحيح البخاری کتاب العلم
واتە : هەرکەس بڵێ (لا اله الا الله) بە نیازپاکی و دڵسۆزیەوە لە دڵیەوە دەچێتە
بەهەشتەوە

.وه ئەم وشەیە لە دوو بەش پێکهاتووە ( لا اله ) نەفی و ( الا الله ) اثبات

لا اله الا الله : لا معبود بحق الا الله [ واتە هیچ پەرستراوێکی بە حەق نییە جگە لە خوا]

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە هیچ کەسێک و شتێک شایەنی ئەوە نییە بپەرسترێ جگە لە الله ، پەرستنیش وەکو : ( نوێژ ، ڕۆژو ، نەزر ، قوربانی کردن ، هاوار لێکردن ، ترسان لێیی ، خۆشەویستی ڕادەبەدەر ، سوێند خواردن پێیی ، شوێنکەوتن و جێبەجێکردنی فەرمانەکان و بەرنامەکەی.....الا اخر ).

وه ئەم واتایەش بەجوانی لە قورئان هاتووە ، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموویت : {فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىَ} سورة البقرة:٢٥٦]
واتە : ئەوەی کوفر بە تاغوت بکات (لا اله ) و ئیمان بەخوا بهێنێت( الا الله ) ئەوە دەستی گرتووە بە ڕێگای سەرفرازی و نەجاتەوە.

## مانای (الطاغوت)چییە ؟

**الطاغوت : بریتییە لە هەر کەسێك و شتێك بپەرسترێ و ئەویش ڕازی بێت یان شەیتانە یان کەسێك حوکم بە غەیری قورئان بکات یان فاڵچیەك یان کاهینێك.

* ئێستاش پێویستە وتەی زانایان بهێنین بۆ شیکردنەوەی ئەم وشە پیرۆزە

١ـ ابن جرير الطبري : "فإنه {لا إله إلا هو} يقول : لا معبود يستحق عليك إخلاص العبادة له إلا الله.

[جامع البيان / تفسير الطبري (ج٩ ص٤٧٩) تحقيق: عبد الله التركي- دار هجر]

واتە : هیچ پەرستراوێک نییە کە شایەنی ئەوە بێت بە دڵسۆزی بیپەرستی جگە لە الله نەبێت

٢ـ **البيهقي (٤٥٨هـ) :** فمعنى الإله الا الله: المعبود، وقول الموحدين: لا إله إلا الله معناه لا معبود غير الله.

[الأسماء والصفات للبيهقي (١ج ص٥٨) ت. الحاشدي]

واته : ماناى الاله واته پەرستراو وە وتەى يەكتاپەرستان كە دەڵێن لا اله الا الله واته هيچ پەرستراوێكى بە حەق نييە جگە لە الله.

٣ـ **القرطبي (٦٧١هـ) :** قوله تعالى: {لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ} نفي وإثبات. أولها كفر وآخرها إيمان، ومعناه لا معبود إلا الله.

[معجم الفروق اللغوية – (ص٦٨) في الفرق بين قولنا الله وبين قولنا إله؛ أبو هلال العسكري توفي بعد ٣٩٥ هجري]

واته : لا اله الا هو نەفى و ئيسباتە يەكەم جار كوفر و دواتر ئيمان واتاكەشى بريتييە لە ( هيچ پەرستراوێكى بەحەق نييە جگە لە الله).

٤ـ **ابن كثير (ت. ٧٧٤هـ):** فقوله {اللَّهُ لا إِلَهَ إِلا هُوَ} إخبار بأنه المتفرد بالإلهية لجميع الخلائق

[تفسير القرآن العظيم (ج١ ص٦٧٨)]

واته :لا اله الا هو ، هەواڵمان پێدەدا كە يەكتا بكرێت لە هەموو پەرستراوێتيەكدا

٥ـ **قال العلامة شيخ ابن عثيمين :** { فمعنى شهادة لا اله الا الله ان يعترف الانسان بلسانه و قلبه انه لا معبود بحق الا الله {

[شرح الاصول الثلاثة ص (٧١)]
واته : ماناى لا اله الا الله ئەوەيە كە بە زمان و دڵ بڕواى تەواو و دان بەوەيا بنێيت كە هيچ پەرستراوێكى بەحەق نييە جگە لە الله.

*لێرەدا بۆمان ڕوون بوويەوە ماناى ئەم وشەيە و هەموو كەسێك خۆى بە موسڵمان بزانێت پێويستە واتاى ئەم وشەيە بزانێت و بزانێت داواكريەكانى ئەو وشەيە چييە.

وە تەنها بەوتنى ئەم وشەيە كەس ناچێتە بەهەشتەوە بەبێ جێبەجێكردنى داواكارييەكانى ئەم وشەيە و بە پشتيوانى خوا مەرجەكانى باس دەكەين دواتر

: وە پەرستنى خواش لە سێ بوارداية كە ئەمانەن

### ١ - ڕبوبیەت:

واتە بڕوات وابێ کە تەنها خوا ژیێنەر و مرێنەر و ڕزق و ڕۆزی دەدات و دروستکەری ئێمە و ئاسمانەکان و زەوییە و بەڕێوەیان دەبات.وە ئەم جۆرە پەرستنە کافرەکانی قوڕەیشیش دانیان پیا ناوە وەکو خوای گەورە دەفەرموویت : { وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ۚ } [لقمان:٢٥]
واتە : ئەگەر لە کافرەکان بپرسی کێ ئاسمان و زەوی درووست کردوە دەڵێن الله
وە دانیشیان بەوە دەنا خوا ڕزق و ڕۆزیان دەدا بەڵام کێشەکە لە پەرستنی غەیری خوا بوو کە دەیان پەرست.

### ٢ـ ئولوهیەت:

واتە پەرستنی خوا لە پەرستنەکان (لە نوێژ ، ڕۆژو ، نەزر ، قوربانی کردن ، هاوار لێکردن ، ترسان لێیی ، خۆشەویستی ڕادەبەدەر ، سوێند خواردن پێیی ، شوێنکەوتن و جێبەجێکردنی فەرمانەکان و بەرنامەکەی.....الا اخر

### ٣ـ ناو و سیفاتەکانی خوا:

دەبێ باوەڕمان بەو ناو و سیفاتانەی خوای گەورە هەبێ کە لە قورئان و سوننە هاتوە بەو شێوەی خۆی وەسفی خۆی کردوە و بە مەخلوقاتی نە چوێنین چونکە هیچ شتێک لەو ناچێ و ئەویش لە هیچ شتێک ناچێت.
{ليس كمثله شيء } [شوری:١١]

## مەرجەکانی(لا إله إلا الله) چین؟

دوای ئەوەی بەباشی و بە پێی ئایەتی خوای مەزن و پاشان وتەی زانایانی سەلەف واتای (لا اله الا الله) مان ڕوون کردەوە ئێستاش پێویستە مەرجەکانی بزانین چونکە بەتەنها وتنی ئەم وشەیە نامان باتە بەهەشتەوە و سودی نابێت هەروەکو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی (لا اله الا الله) کلیلی بەهەشتە بەڵام هەموو کلیلێکیش ددانەی خۆی هەیە تا دەرگای پێبکەیتەوە .
بۆیە لەسەرمان پێویستە مەرجەکانی بەجوانی بزانین و کاری پێبکەین

### ١ـ العلم : المنافي للجهل

واتە زانیاری بە واتای ئەو وشەیە کە دژی نەزانینە هەروەکو خوای گەورە دەفەرموویت : { فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ }[ محمد :١٩]
.واتە: بزانە کە هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە الله
وەلە فەرموودەشدا هاتووە کە رسول الله( صلی الله علیه وسلم) دەفەرموویت : { مَنْ مَاتَ وَهُوَ يَعْلَمُ أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله دَخَلَ الْجَنَّةَ } رواه مسلم
واتە : هەرکەس بمرێت و زانیبێتی کە هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە دەچێتە بەهەشتەوە.

## ٢ : الصدق : المنافي للتكذيب

واتە ڕاستگۆی کە دژی درۆکردنە ، خوای تعالی دەفەرموویت : { فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ } [العنكبوت ١-٣]
واتە : بێگومان ئەوانەی ڕاستیان کردووە دەرکەون و ئەوانەشی درۆیان کردووە دەرکەون.

وە لە فەرموودەشدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا( صلى الله عليه وسلم) دەفەرموویت { مَا مِنْ أَحَدٍ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ صِدْقًا مِنْ قَلْبِهِ ، إِلَّا حَرَّمَهُ اللَّهُ عَلَى النَّارِ } متفق عليه
واتە : هیچ کەسێک نییە کە شایەتی بدا کە هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە الله و محمدیش نێرراو و عەبدی خوایە ڕاستگۆیانە لە دڵیەوە ئیلا خوا ئاگری لەسەر حەرام دەکات.

## ٣ ـ اليقين : المنافي للشك

واتە دڵنیایی کەدژی گومانە ، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموویت : { إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ }[ الحجرات:١٥ ]
واتە : ئیمانداران ئەوانەن کە باوەڕیان بەخوا و پێغەمبەر هێناوە و پاشگەزنەبوونەتەوە و تێدەکۆشن بە ماڵ و نەفسیان لە پێناو خوای گەورە ئەوانە ڕاستگۆیانن.
وە لە فەرموودەشدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا( صلى الله عليه وسلم )دەفەرمویت : { أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ ، لَا يَلْقَى اللَّهَ بِهِمَا عَبْدٌ غَيْرَ شَاكٍّ ، فَيُحْجَبَ عَنِ الْجَنَّةِ }.. الحديث أخرجه مسلم، حديث (٢٧)، وأما البخاري فروى نحوه من حديث سلمة بن الأكوع، في "كتاب الشركة" "باب الشركة في الطعام والنهد والعروض" حديث (٢٤٨٤)

واتە : شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە الله و محمدیش نێرراوی خوایە و هەرکەسێک بەمەوە و بێ گومان بچێتەوە لای خوا ئیلا دەچێتە بەهەشتەوە.

## ٤ ـ الاخلاص: المنافي للشرك و القصد لغيره

واتە دڵپاکی و دڵسۆزی کە دژی شيرك و غەیری خوا مەبەست بوونە ، خوای گەورە دەفەرموویت : { أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ } [الزمر:٣ ]
واتە : دینی ڕاستگۆیانە ( پەرستن و عیبادات ) تەنها بۆ خوایەپێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموویت : { أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَنْ قَالَ : لا إِلهَ إلاَّ اللهُ خَالِصاً مِنْ قَلْبِهِ أَوْ نَفْسِهِ } البخاري
واتە : خۆشبەختترین کەس بە شفاعەتی من لە ڕۆژی دوایدا ئەو کەسەیە کە گوتبێتی (لا اله الا الله )بە دڵپاکیانە لە دڵیەوە

## ٥ ـ المحبة:المنافي للبغض

واته خۆشەویستی کە دژی ڕقلێبونەوەیە ، خوای گەورە دەفەرموویت : { وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَتَّخِذُ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَنْدَادًايُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِلَّهِ } [ البقرة :١٦٥]

واتە : هەندێک کەس شتانێکیان کردووە بەخوا و خۆشیان دەوێن وەکو خوا بەڵام بڕواداران خۆشەویستی زۆریان تەنها بۆ خوایە.

پێغەمبەری خواش( صلى الله عليه وسلم )دەفەرموویت : { ثَلَاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ ، وَجَدَ حَلَاوَةَ الْإِيمَانِ ؛ أَنْ يَكُونَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ ، أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا } حديث صحيح
واتە : سێ کەس خۆشی و حەلاوەتی ئیمان دەچێژن کەسێک خوا و پێغەمبەرەکەی لە هەموو کەس خۆشتر بوویت.

## ٦ ـ الانقياد : المنافي للترك

واتە ملکەچبوون کەدژی وازلێهێنانە ، پەروەردگار دەفەرموویت : { فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُواْ فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا} [النساء: ٦٥]
واتە : بەدڵنیاییەوە ئیمان ناهێنن تاوەکو حوکم نەکەن بەوەی خوا ناردویەتی و پاشان هیچ لە نەفسیان درووست نەبێت و پێوەی تەسلیم و ملکەچ بین.

پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموویت : { لَا يُؤْمِن أَحَدكُمْ حَتَّى يَكُون هَوَاهُ تَبَعًا لِمَا جِئْت بِهِ } حديث صحيح
واتە : ئیمان نایەنن تا واز لە هەواو ئارەزووەکانتان نەیەنن بۆ ئەوەی من هێناومە.

## ٧ ـ القبول: المنافي للرد

واتە وەرگرتن کە دژی ڕەدکردنەوەیە ، پەروەردگار دەفەرموویت : { إِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ } [الصافات :٣٥]
واتە : ئەوانە کاتێ پێیان وترابا بڵێن کە هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە الله تەکەبوریان دەکرد و فیزیان دەکرد و وەریان نەدەگرت ئەو وشەیە.

# هەڵوەشێنەرەوەکانی (لا إله إلا اللّه)

مرۆڤ دوای ئەوەی ئیمانی هێناو تەسلیمی خوا بوو و بەهەموو مەرجەکانەوە شایەتی درووستی دا کەهیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە اللە ئەوە پێویستە خۆشی لە هەڵوەشێنەرەوەی ئەو شایەتییەی داویەتی بپارێزێت و لەکۆمەڵێ شت دورکەوێتەوە ئەوانەش بریتین لە ئەم هەڵوەشێنەرەوانە کەمرۆڤ گەر تووشی یەکێ لەم خاڵانە ببێت پێیی لەدین دەردەچێت و دەچێتە دۆزەخ بۆ هەمیشەیی گەر مرد و تۆبەی لەسەر نەکات وە خەڵکانێکی زۆریش تووشی ئەم هەڵوەشێنەرەوانە بوون و پێشی نازانن بەهۆی کەم عیلمیان لە دین و نەزانینیانەوە ئێمەش دە لەو خاڵانەمان هێناوە کە تێکرای زانایانی سەلەف یەکدەنگن لەسەری لەگەڵ ئەوەشدا خاڵی زۆر زۆرتریش هەن بەڵام ئەم ١٠ خاڵە زۆر باوە ئەوانەش بریتین لە

## ١ـ شەریك بۆ خودا بریاردان.

گەرەترین تاوان و هەڵوەشێنەرەی ئیمان بریتییە لە هاوەڵ بڕیاردان بۆ خوادایەك کە هەموو پێغەمبەرانی لە پێناوی پەرستنی خۆی ناردوە بۆ بەشەریەت و لێخۆشبوونی بۆ نییە مەگەر تەوبەیەکی دروست و ڕاستی لەسەر نەکات ،خوای گەورە دەفەرموویێت : {إِنَّ اللَّهَ لا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ} [سورة النساء:٤٨]

واتە : خوای گەورە لە شیرک هەرگیز خۆش نابێت لە غەیری شیرک خۆشدەبێ بۆ کەسێک گەر ویستی لەسەر بێت

(وە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموویێت : {إِنَّهُ مَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ}

واتە : ئەوەی شەریك بۆ خودا بڕیار بدات بەهەشتی لەسەر حەرام دەبێت و دەخرێتە ئاگرەوە.

: دەبێ بشزانین کە شەریک بۆ خودا بڕیار دان دوو جۆرە گەورە و بچووک

### * شیرکی گەورە:

ئەم جۆرە مرۆڤ لەدین دەباتە دەرەوە و لەسەری بمرێ بێ تۆبە کردن بەهەمیشەی لەدۆزەخدایە ، وەکو باسمان کرد خوای گەورە هەرگیز لە شیرک خۆشنابێ خوای گەورە دەفەرموویێت : {إِنَّهُ مَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ} [سورة المائدة:٧٢]

واتە : ئەوەی شەریک بۆ خودا بڕیار بدات بەهەشتی لەسەر حەرام دەبێت و دەخرێتە ئاگرەوە

: جۆرەکانی شیرکی گەورە زۆرن بەڵام باوترینیان ئەمانەن

أـ پشت بە غەیری خوا بەستن: هاوار کردنە غەیری خوا

پشت بەست بە غەیری خوا شیرکی گەورەیە و پێیی کافردەبیت خوای گەورە دەفەرموویێت : { وَعَلَى اللَّهِ فَتَوَكَّلُوا إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ } [سورة المائدة:٢٣]

واتە: گەر بڕوادارن پشت بەخوا ببەستن

وە لە ئایەتێکی تردا : { وَأَنَّ الْمَسَاجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَدًا } [سورة الجن:١٨]

واتە : مزگەوتەکان بۆ خوان و داوا لە غەیری خوا مەکەن.

ئەم ئایەتانە بەڕونی دەریدەخەن کەنابێ پشت و هاوار کردنت پەیوەست بکەیت بە جگە لە الله وە خوای گەورە داوامان لێ دەکات کە پشت بەو ببەستین و داوا تەنها لە ئەو بکەین { ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ } [سورة غافر:٦٠]
واتە : داوام لێ بکەن جوابتان دەدەمەوە

**ب ـ دان بەوەدا نەنان کە هەرچی ناز و نیعمەتێک هەیە هەرلەخواوەیە:**
خوای گەورە لەسەر زاری موشریکانی قورەیش دەفەرمووێت : { قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَمَن يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَن يُدَبِّرُ الْأَمْرَ ۚ فَسَيَقُولُونَ اللَّهُ ۚ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ} [سورة یونس:٣١]
واتە :پێیان بڵێ ( موشریکەکان ) کێیە ڕزقتان دەدا لە زەوی و ئاسمان وە کێ بیستن و بینینی پێ بەخشیون و زیندوو دەمرێنێ و مردوش زیندوو دەکاتەوە و کێ بەڕێوبەری گەردونە دەڵێن الله دەبڵێ پێیان بۆ تەقوای خوا ناکەن و ناپەرستن و شەریکی بۆ بڕیار دەدەن
لە ئایەتێکی تردا : { قُلْ لِمَنِ الْأَرْضُ وَمَنْ فِيهَا إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ (٨٤) سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ (٨٥) قُلْ مَنْ رَبُّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ (٨٦) سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ (٨٧) } [سورة المؤمنون:٨٤-٨٧]
واتە : بڵێ ئەم زەوییە و ئەوەی تیایی دایە هی کێیە ئەگەر بزانن دەڵێن الله ، بڵێ ئەی بۆ بیرناکەنەوە بڵێ کێ پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکەو عەرشی مەزنە دەڵێن الله دەی پێیان بڵێ بۆ لەخوا ناترسن.

**ج ـ سەربڕین بۆ غەیری خوا:**
هەر سەربڕینێک کەدەکرێ بۆ عیبادەت دەبێ بەس بۆ خواکرێ و تەنها ناوی ئەوی لەسەر بێت گەر (وانەبێ بۆ غەیری خوات کردووە ، خوای گەورە دەفەرمووێت : { فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ }[الكوثر-٢]
واتە : نوێژ و سەربڕین بەس بۆ خودا بکە
لە فەرمودەیەکیشدا رسول الله( صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت : { وَلَعَنَ اللهُ مَنْ ذَبَحَ لِغَيْرِ اللهِ } [صحيح مسلم]

واتە : لەعنەتی خوا لەوەی سەربڕین بۆ غەیری خوا دەکات
**د ـ تەواف کردن بە غەیری ماڵی خوا:**
هەرکەس تەواف بەدەوری قەبر یان هەر شتێکی تر بکات جگە لە ماڵی خوا ئەوە کافر بووە خوای تعالى دەفەرمووێت : { وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ }[سورة الحج:٢٨]
واتە : تەواف بکەن بەدەوری ماڵی خوا.

**و ـ حوکم کردن بە غەیری بەرنامەی خوا و یاسا دارشتن:**

هەرکەس یاسایەک دابنێ و وا لە خەڵکی بکات پێوەی پابەند بن و لێیی لانەدەن و حوکمی خوا بگۆڕێت و قانونی دەستکردی مرۆڤ جێگەی بگرێتەوە کافردەبێ و هەرکەسیش شوێنی ئەوانە بکەوێت و باوەڕی پێیی هەبێت کافرە جا با نوێژ و ڕۆژوش بکات ، خوای گەورە دەفەرمووێت : { أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ} [الاعراف:٥٤]
واتە : خەڵق کردن و یاسا دارشتن بەس هی خوایە
لە ئایەتێکی تردا : { إِنِ الْحُكْمُ إِلا لِلهِ } [الانعام:٥٧]
واتە : حوکم تەنها بۆ خوایە

خوای گەورە حوکم کردنی بەغەیری بەرنامەی ئەو پێ کوفرە و خاونەکەی لا کافرە : { وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ } [المائدة:٤٤]
واتە : ئەوەی حوکم نەکا بەوەی خوا دایبەزاندووە لە کافرانە

## ز- شیرکی شوێنکەوتن

واتە شوێنکەوتنی کەسێک حەرامت بۆ حەڵاڵ کات و حەڵاڵت بۆ حەرام بکات خوای گەورە دەفەرموێت : { اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُوا إلا لِيَعْبُدُوا إِلَهًا وَاحِدًا لا إِلَهَ إلا هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ } [التوبة:٣١]
واتە : جولەکە و یەهودیەکان قەشە و فاڵچیەکانیان دەکردە خواچگە لە الله و شوێنیان دەکەوتن و مەسیحیان دەکردە خوا خواش ئەمری پێکردون کە تەنها ئەو بپەرستن.

.
پەرستنەکەیان لە فەرموودەدا هاتووە کە لە پێغەمبەری خوایان پرسی (صلى الله عليه وسلم )فەرمووی ئایا حەرامیان بۆ حەڵاڵ و حەڵاڵیان بۆ حەرام نەدەکردن

## ی ـ باوڕە نە هێنان بەهەموو ئەوەی لەدیندا هەیە

وەکو باوەڕنەبوون بەیەک ئایەت و شتێکی شەرعی چەسپاو لە دیندا ، الله تعالى دەفەرمووێت : { أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ } [البقرة:٨٥]
واتە: ئایا باوەڕ بە هەندێکی کتێبەکانمان دەکەن و باوەڕیش بە هەندێکی ناکەن

## * شیرکی بچووك:

ئەم جۆرە شیرکە مرۆڤ لە دین ناباتە دەرەوە بەڵام خوای گەورە لێشی خۆش نابێ تا سزایی نەدا و لەهەموو تاوانێك گەورەترە جۆرەکانیشی بریتین لە

## أـ سوێند خواردن بە غەیری خوا

سوێند خواردن دەبێ بەس بە خوا بێ یان قورئان یان بە سیفەت و ناوەکانی خوای گەورە غەیری ئەوە شیرک و کوفرە ، پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت : { مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ اللَّهِ فَقَدْ كَفَرَ أَوْ أَشْرَكَ } (*)
واتە : ئەوەی سوێند بخوا بە غەیری خوا کوفر یان شیرکی کردووە

[ *[رواه الترمذي وحسنه وصححه الحاكم وقال الألباني صحيح أنظر صحيح الترغيب والترهيب حديث رقم ٢٩٥٢]
قال الحافظ ابن حجر: " والتعبير بقوله: فقد كفر أو أشرك للمبالغة في الزجر والتغليظ في ذلك، وقد تمسك به من قال بتحريم ذلك " {فتح الباري: ١١ـ٥٣١}
قال أبو جعفر الطحاوي: " ولم يرد به الشرك الذي يخرج من الإسلام حتى يكون به صاحبه خارجًا عن الإسلام، ولكنه أراد أنه لا ينبغي أن يحلف بغير الله تعالى، لأن من حلف بغير الله تعالى فقد جعل ما حلف به محلوفًا به، كما جعل الله تعالى محلوفًا به، وبذلك جعل من حلف به أو ما حلف به شريكًا فيما يحلف به، وذلك أعظم، فجعله شركًا بذلك شركًا غير الشرك الذي يكون به كافرًا بالله تعالى خارجًا عن الإسلام]

ب ـ مورو هەڵواسین
مورو و چاوەزار هەڵواسین پێت وابێ خوای گەورە بەهۆی ئەمەوە شیفات دەدات ، پێغەمبەری خوا( صلى الله عليه وسلم) دەفەرموویێت : { مِنْ عَلَّقَ تَمِيمَةً فَقَدْ أَشْرَكَ}*
واتە ئەوەی شتێک هەڵواسێت ( پەڕۆیەک یان موروویەک ) شەریکی بۆ خوا بڕیار داوە.

*[أخرجه أحمد في "مسنده" (١٧٦٩٤): حدثنا عبد الصمد بن عبد الوارث ـ٢٥
والحارث بن أبي أسامة في "مسنده" (٥٦٣ – بغية الباحث)، ومن طريقه ابن مخلد البزاز في "حديثه عن شيوخه" (٣).: حدثنا عبد العزيز بن أبان
والطبراني في "المعجم الكبير" (٣١٩/١٧): حدثنا علي بن عبد العزيز، ثنا مسلم بن إبراهيم]

تێبینی/ئەگەر کەسەکە پێی وابێ ئەو مورووە دەیپارێزی لە بەڵاو ناخۆشی ئەوا شیرکی گەورەیە پەنا بەخوا بەڵام ئەگەر پێی وابێ خوای پەروەردگار بەهۆی ئەو مورووەوە دەیپارێزێ ئەوە شیرکی بچوکە.والله اعلم.

ج ـ ڕییا
کەسێک عیبادەتێ یان هەر چاکەیەک بکات و بۆ ئەوەی بێ خەڵکی پێی بڵێن پیاوی ساڵح و چاکە ،پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)دەفەرموویێت : { أَخْوَفَ مَا أَخَافُ عَلَيْكُمْ الشِّرْكُ الْأَصْغَرُ . قَالُوا : وَمَا الشِّرْكُ الْأَصْغَرُ يَا رَسُولَ اللَّهِ ؟ قَالَ : الرِّيَاءُ }

[ قال الألباني في "السلسلة الصحيحة" ٢ / ٦٧١ -
رواه أحمد (٥ / ٤٢٨ و ٤٢٩) و أبو محمد الضراب في "ذم الرياء"(٢/٢٧٧)]

واتە : ئەوەی من لێیی بترسم لە سەر ئێوە شیرکی بچووکە ، گوتیان شیرکی بچوك چییە ئەی پیغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)؟ فەرمووی بریتیە لە ڕیا

د ـ کەسێك بڵێ ( ماشاء الله وشئت)
واتە گەر کەسێک وتی خواو تۆ ئیزنتان لەسەر ئەو کارە بێت یان بڵێت لەسایەیی تۆ و خواوە باشین ئەوە شیرکی بچووکە ، پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)دەفەرموویێت : { لا تَقُولُوا : مَا شَاءَ اللَّهُ وَشَاءَ فُلانٌ ، وَلَكِنْ قُولُوا : مَا شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ شَاءَ فُلانٌ } رواه النسائی اوصححه.
واتە : مەڵێن خواو فلان ئیزنتان لەسەر ئەو کارە بێت بەڵکو بڵێن خواو پاشان فلان ئیزنتان لەسەر ئەو کارە بێت.

تەواو دەچینەوە سەر هەڵوەشێنەرەوەکان گەیشتینە خاڵی دووەم.

٢ـ واستە لە نێوان خۆت و خوا دابنێی:
وەکو داواکردن لە غەیری خوا و بەخواشیان نەزانی و بەڵام بڵێیی ئێمە تاوان بارین و دەنگمان بەخوا ناگا و ئەوان شەفاعەتمان بۆ دەکەن لای خودا ئەم جۆرەش باوترینە لەناو خەڵکیدا خوا پەنامان بدات بەوەی دەڵێن بەبێ واستە ئێمە دەنگمان بەخوا ناگات وەکو چۆن پاشایەك بچی بۆلای دەبێ لای وەزیرەکەی واستە بکەی تا بیبینی کە ئەمەش کوفرە دەیڵێن چونکە خوای گەورە بەو گەورەییەی خۆیەوە کە بێ نیازە لەهەموو شتێک دەشوبهێنێ بە مەخلوقێکی زەعیف سبحان الله ، خوای گەورە باسی حاڵی موشریکەکان دەکات و دەفەرموویێت : { مَا نَعْبُدُهُمْ إِلاَّ لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى } [الزمر:٣]
واتە : ئەوانەی هاناو هاواریان لەو بتانە دەکرد دەیان وت ئێمە نایان پەرستین بەڵکو داوایان لێ

دەکەین تا لەخوامان نزیک بخەنەوە.....یان {ویقولون هؤلاء شفعاؤنا عند الله } [یونس:١٨]
واتە : دەیان وت ئەمانە شەفاعەتمان بۆ دەکەن لای خودا

## ٣ـ بەکافر دانەنانی کافرەکان و گومان لە کافریان:

هەرکەس ئەوانەی کە لەسەر دینی ئیسلام نین وەکو جولەکە و گاورەکان و مەجوسی و زەردەشتی و بوزایی ویەزیدی و کاکەی و دینەکانی تر بە کافر و موشریک نەزانێ یان کەسێ کوفر و شیرکی وازحی هەبوو لە قورئان و سوننەت بەکافر لەقەڵەم درابوو و تاغوتەکان و شوێنکەوتوانیان بەکافر نەزانێ ئەوا ئەوکەسەکافرە دوای ئەوەی گومانی هەبوو وەوتی لەسەرم نییە کافریان کەم و پاش ڕونکردنەوەی بۆی کافرەبێ ، خوای گەورە دەفەرموێت : { وَقَالَتِ الْيَهُودُ عُزَيْرٌ ابْنُ اللَّهِ وَقَالَتِ النَّصَارَى الْمَسِيحُ ابْنُ اللَّهِ } [التوبة:٣٠]
واتە : جولەکەکان دەڵێن عزیر کوڕی خوایە و گاورەکانیش دەڵێن مەسیح کوڕی خوایە

گاورەکان دەڵێن خوا سێ یە ( الله و مەسیح و مەریەم ) خوا پەنامان بدات.....جولەکەش دەیان وت فریشتەکان کچی خوان و عوزیر کوڕی خوایە سبحان الله خوا پەنامان بدا لەم کافرانە

## ٤ـ شوێن کەوتن یان پێ ڕاستبوونی دین و بەرنامەی تر:

هەرکەس شوێن هەر بەرنامە و یاسا و دینێکی تر بکەوێ و بەڕاستی بزانێ یان بەرنامەی دەستکرد جێبەجێ بکات کافرە ، پەروەردگار دەفەرمووێت : { فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّىَ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُواْ فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا } [النساء:٦٥]
واتە : بەدڵنیایەوە ئیمان ناهێنن تاوەکو حوکم نەکەن بەوەی خوا ناردویەتی و پاشان هیچ لە نەفسیان درووست نەبێت و پێوەی تەسلیم و ملکەچ ببن

## ٥ـ ڕق لێبوونەوەی شتێک لەدینی خوا:

هەرکەس ڕقی لە شتێکی دین ببێتەوە کە رسول الله( صلى الله عليه وسلم) هێناویەتی گەر کاریشی پێبکا بێگومان کافربووە ئەو کەسە وەکو ڕق لێبوونەوەی قورئان و ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە و سوننەتەکان ، خوای گەورە دەفەرموێت : { ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ } [محمد:٨]
واتە : ئەوانە ڕقیان لەوە دەبوویەوە خوا ناردبووی بۆیە کردەوەکانیانمان هەڵوەشاندەوە
برای موسڵمان ڕقت لە ڕیش و سیواك و سوننەت نەبێتەوە با بەر هەڕەشەی خوا نەکەوی!

## ٦ـ گاڵتەکردن بەدین:

هەرکەس گاڵتە بە هەر شتێکی ئیسلام بکا بە گاڵتەش بێ بۆ خۆشی کافرە ئەو کەسە ، الله گیان دەفەرمووێت : { وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِؤُونَ لا تعتذروا قد كفرتم بعد ايمانكم } [التوبة:٦٤]
واتە : بڵێ ئایا ئێوە گاڵتەبەخوا و ئایەتەکانی و پێغەمبەرەکەی دەکەن عوزر مەهێننەوە ئێوە کافربوون دوای ئیمانتان
ئەم ئایەتە لەسەر کۆمەڵێك کەس دابەزی گاڵتەیان بە سەحابەکان دەکرد دواتر ئەم ئایەتە دابەزی و خوای گەورە کافری کردن پاش ئەوەی ئیمانیشیان هەبوو دەیان وت ئێمە بەس بۆ گاڵتە و یاری وامان وتووە بەڵام ئەوە دادی نەدان و کافربوون
برای موسڵمان گاڵتە بە ڕیش و سیواك و سوننەت و دین و موسڵمان مەکە با بەر هەڕەشەی خوا نەکەوی و بێ دین نەبیت

## ٧- سيحر:

هەركەس بڕوای بە سیحر و جادو و نوشتەی فاڵچیان هەبێ و ئەو کارە بکات کافرە ئەوانەی ژن و مێرد لەیەک دەکەن و نووشتەی شەڕ و خراپە دەخەنە نێو ماڵەکان ، الله گیان دەفەرمووێت : { وَلَكِنَّ الشَّيَاطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ } [البقرة:١٠٢]
واتە : شەیتانەکان کافربوون و خەڵکیان فێری سیحر دەکرد
پێغەمبەری خوا( صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت : { مَنْ أَتَى كَاهِنًا، أَوْ عَرَّافًا، فَصَدَّقَهُ بِمَا يَقُولُ، فَقَدْ كَفَرَ بِمَا أُنْزِلَ عَلَى مُحَمَّدٍ صلى الله عليه وسلم» }

[رواه أبو داود و الترمذي و النسائي وابن ماجه و الحاكم و قال صحيح على شرطهما و صححه الألباني في صحيح الترغيب].

واتە : ئەوەی بڕواتە لای فاڵچی و فاڵگرەوەیەک و بڕوای پێ بکا بەوەی دەیڵێ ئەوە کافربووە بە قورئان

## ٨- یارمەتی دانی کافرەکان دژی موسڵمانان:

هەركەس بەدڵ و زوبان و کردەوە هاوکاری کافران و پێیی خۆشبێ کافر سەرکەوێ بەسەر موسڵمانان ئەوە کافربووە بەدین ، خوای گەورە دەفەرمووێت : { يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاء بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ إِنَّ اللّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ} [المائدة:٥١]
واتە : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جولەکە و گاورەکان مەکەنە هاوڕێی و دۆستی خۆتان ئەوەی لەگەڵیان بێت ( دژی موسڵمانان ) ئەوە وەکو ئەوانە ( کافرە)

## ٩-ئەوەی بڕوای وابێ هەندێ کەس دەتوانن لە شەریعەت دەربچن وەکو چۆن خضر لە شەرعی موسا دەرچوو ئەوە کافرە:

هەندێ کەس بڕوای وایە کە هەندێ شێخ و مەشایەخ تەکلیفیان لەسەر نەماوە و دەتوانن کردەوە بکەن واز لە شەریعەت بێنن ئەوە کافرە ئەو کەسە وە خوای گەورەش ئەم دینەی بۆ هەموو گرۆی جیهانیان ناردووە نەک قەومێکی دیاری کراو{ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ } [الانبياء:١٠٧]
خوای گەورە دەفەرموێت : { وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ }[ ال عمران : ٨٥ ]
واتە : ئەوەی غەیری ئیسلام بگرێتەبەر و بەرنامەی ژیانی ئەوە لێیی قبوڵ ناکرێت و لە ئاخیرەتیشدا لە خوسارەتمەندان دەبێ

## ١٠ـ دورکەوتنەوە لە دینی خوا و خۆ فێرنەکردنی پشت تێ هەڵکردن:

هەرکەس خۆی فێری بنەماکانی دین نەکا و فێرنەبێ و پشتی لێ هەڵکا ئەوە کافر بووە بەدین ، خوای گەورە دەفەرموویێت : { وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِآيَاتِ رَبِّهِ ثُمَّ أَعْرَضَ عَنْهَا إِنَّا مِنَ الْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ }[السجدة:٢٢]

واتە : کێ لەو کەسەزاڵم ترە کاتێ یادی خوا دەکرێ و باسی دینەکەی دەکرێ پشت هەڵدەکات بەڕاستی ئێمە تۆڵە لە تاوان کاران دەستێنین

وە هیچ جیاوازی نییە لە نێوان ئەم هەڵوەشێنەروانە گەر کەسێ بە گاڵتە بیکا یان حەلاڵی نەکا و بکەوێتە ناوی یان نکوڵی نەکا و بکەوێتە ناوی کافر دەبێ ئیلا گەر بەزۆر پێیی بکرێ و بەڵام لەدڵەوە پڕ ئیمان بێ ئەوسا کافر نابێ هەروەکو الله گیان دەفەرمووێ : { إِلا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالإِيمَانِ }[النحل:١٠٦]
واتە : مەگەر کەسێک بەزۆر کوفری پێبکرێ و دڵی پڕ ئیمان بێت

## فەزڵەکانی (لا إله إلا اللّه)

### ١ـ تاوانەکان دەسڕێتەوە:

قال أبو ذر قلت يا رسول الله كلمني بعمل يقربني من الجنة ويباعدني من النار قال ( إذا عملت سيئة فاعمل حسنة فإنها عشر أمثالها ). قلت يا رسول الله لا إله إلا الله من الحسنات قال: ( هي أحسن الحسنات وهي تمحو الذنوب والخطايا )

واتە: ئەبو زەڕ رضی الله عنه دەفەرمووێت وتم بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم) وشەیەکم پێ بڵێ کە لە بەهەشت نزیکم بکاتەوە و لە دۆزەخ دورم بخاتەوە فەرمووی: (ئەگەر تاوانێکت ئەنجام دا چاکەیەک بکە چونکە دەهێندەی ئەوە) وتم ئەی پێغەمبەری خودا (لا إله إلا الله) لە چاکەکانە؟ فەرمووی ئەوە باشترینی چاکەکانە و خراپەکان دەسریتەوە.

### ٢ـباشترین زیکرە:

حديث جابر المرفوع ( أفضل الذكر لا إله إلا الله ) .

پێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی : ( باشترین زیکر واتە : لە جابرەوە دەفەرمووێت لا اله الا الله یە ).

## ٣-بەوتنی زامنی بەهەشتە:

وفي الصحيحين عن عبادة بن الصامت رضي الله عنه عن النبي قال : ( من قال أشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأن محمدا عبده ورسوله وأن عيسى عبد الله ورسوله وكلمته ألقاها إلى مريم وروح منه وأن الجنة حق والنار حق أدخله الله من أي أبواب الجنة الثمانية شاء ) .

واتە: لە سەحیحەیندا هاتووە کە لە عبادە ی کوڕی سامتەوە رضی الله عنه لە پێغەمبەری خودا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەوەی بڵێ هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییەجگە لە الله و تاك و بێ هاوەڵە و وە محمدیش بەندە و و نێردراوی خودایە و عیساش بەندەو نیردراوی خوایە بەهەشت و دۆزەخ ڕاستە ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە ئەو کەسە لە هەر دەرگایەکی بەهەشت کە هەشتە بەویستی خۆی

## ٤- دۆزەخت لەسەر حەرام دەکات:

أخرج البخاري ومسلم في الصحيحين عن أنس رضي الله عنه قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : ( ما من عبد يشهد أن لا إله إلا الله وأن محمدا عبده ورسوله إلا حرمه الله النار ) .

واتە: لە ئەنەس رضی الله عنه دەفەرمووێت لە پێغەمبەری خودا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هیچ بەندەیەك نییە شایەدی بدات کە هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە الله وەە محمدیش (صلی الله علیه وسلم) بەندە و نێردراوی خودایە ئیلا خودا دۆزەخی لەسەر حەرام دەکات

## ٥-شەفاعەتت بە نسیب دەکات:

احاديث البخاري ومسلم عن ابي هريرة رضي الله عنه ،قال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(اسعد الناس بشفاعتى يوم القيامه من قال لا اله الا الله خالصا من قلبه، او نفسه)

واته : خۆشبەخترین کەس بە شەفاعەتی من لە ڕۆژی دوایدا ئەو کەسەیە گوتبێتی لا اله الا الله بە نیازپاکی لە دڵیەوە یان نەفسیەوە

## ٦- لە شەیتان پارێزراوت دەکات:

رواه الترمذي عن عمارة بن شبيب السبأي رضي الله عنه قال قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : ( من قال لا إله إلا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد يحيي ويميت وهو على كل شيء قدير عشر مرات على إثر المغرب بعث الله مسلحة يحفظونه من الشيطان حتى يصبح وكتب الله له بها عشر حسنات موجبات ومحا عنه عشر سيئات)

واتە: لە عمارة کوڕی شبیب سەبەئی رضی الله عنه دەفەرمووێت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (هەر کەس بڵێت کە هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە الله و تاک و بێ هاوتایە و موڵك و حەمد تەنها بۆ ئەوە و زیندوو کەرەوە و مرێنەرە و بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە دەجار بیڵێت لە شێواندا ئەوا خودای گەورە پاسەوانی بۆ دادەنێ کە تاوەکو ڕۆژ دەبێتەوە لە شەیتان ت و دە چاکەی بۆ دەنوسرێ و دەخراپەشی دەسڕێتەوە پارێزراو دەبێ

ئەمە ژمارەیەکی کەم لە فەزڵەکانی لا الە الا اللە بوو هەرچەندە زۆرن بەڵام ئەمانە زۆر گرنگن - هەرکەس بیەوێ دەتوانێ بگەڕێت تا فەزڵی زیاتری فێر ببێت

داواکارم خوای گەورە لێمان ڕازی بێت و بمانخاتە سەر ڕێگای هیدایەت و ڕێگاکەمان بۆ ڕۆشن بکاتەوە و ئەم کەلیمەیەمان لێ قبوڵ بکات اللهم امین.......

## نسأل اللّه أن يثبتنا وإياكم، بالقول الثابت، في الحياة الدنيا، وفي الآخرة.

## واللّه أعلم

إبراهيم محمد

19-10-2017